**دیوانی" ئەسەد"**
**سەرجەمی شیعرەکانی خوالێخۆشبوو:**
***"میرزائەسەدوڵا غوڵامعەلی"***

## «موناجات ۱»

مــن لــه دونیــادا سەراســەر زینــدەگانیم غەفــڵەتە
زیکــر و ئــەوڕادم هەمیــشە خودنــەمایی و غەیبەتــە
گاهــیّ دڵ بــەحرە لەبــەر تەعییــشی ئــەتفال و عــەیال
گاهــیّ غــەرقی زینــەتی ئەســباب و خانــە و کیــسوەتە
ئیــشتغاڵی ســوبح و شــامم ســەب و شــەتمی خەڵــکیە
ڕۆژگــارم ســەرفی خەشــم و بــوغز و کینــە و بیدعەتــە
موتتەســیل زەم کــردن و بــوخڵ وحەســادەت کارمــە
فــەهم وئیــدراکم نیــە گــەر جوومڵــە بــۆ مــن عەودەتــە
زاهیریــن نــۆژیش دەکــەم جارجــارە نــەک بــیّ دەغدەغــە
باتینــەن ئــەعمالی مــن فیــسق و فجــوور و شــەهوەتە
وا مــوتیعی نەفــسی ئــەممارەم لــە ئەشــیائی حــەرام
هــەرچی دەســگیرم ببــیّ پــێم وایــە شــەهد وشــەربەتە
بەســکە بــیّ بــاک و غــروور و خودپەســەند و ئەحمــەقم
فیکــری وەی ناکــەم کــە فــەردا ڕۆژی کــۆچ و ڕیحلەتــە
یــا ئیلاهــی مــن ســەفەرکەردەی ســیراتی مەحــشەرم
ســازی ڕێــشم بــاری زەنــب و ئینفیعــال و خەجــڵەتە
تاعــەت و تــەهلیل و تەســبیح و ســەلاتم هــیچ نیــە
بــۆ قیامــەت هــەر گونــاە و شەرمەســاریم ســەروەتە
وەزعــی ئــەعمالی قــەبیحم خــۆ بــە خــۆم شــەرح نــادریّ
خــۆت عــەلیمی گــەر دەروونم پــڕ لــە ویــزر و قیــسوەتە

یـــا ئیلاهەلعالـــەمین گـــەر مـــن زەلیـــل و بـــیٚ نـــەوام
نائومیـــد چـــۆن بم لـــەدرگای تـــۆ سەراســـەر نیعمەتـــە
هەر کەسێک مەعسوومە تۆ بەخشیوتە وا پاکـە لـە جورم
بەنـدەیی عاسـیت ببەخـشە چـوون ئـەویش هـەر بەندەتـە
یـــا ڕەسوولەڵـــڵا خـــەتابارو زەلیـــل و مـــوجریم
مایـەیی تەسـدیعی تـۆم ڕۆژیٚ کـە خـەوف و دیهـشەتە
تـــۆ پـــەناه و تـــۆ مـــەلازی بـــۆ گـــورووهی مـــوزنبین
مـــن پەناهینـــدەم بـــە درگاهـــت کـــەجورمم کیـــسرەتە
تـــۆ شـــەفیعی ئوومـــەت و مـــن ڕووســـیاهی ئوومـــەتم
چـۆن ڕەوایـە دۆزەخـی بێـت عاسـیمیٚ گـەر عیـسرەتە
خیسلەت و ڕەفتاری من گەر وایە هەر وەک سەگ سـەگم
بـەو ئومیـدەم گـەر سـەگی ئەسـحاب، ئـەهلی جەننەتـە
عوومری چەند ساڵەم بە بادا سـەد کـەڕەت خـاکم بەسـەر
تازەکانـــیٚ نـــادیم گـــەر فایـــدەی هـــەر حەســـرەتە
ئـەی خووداوەنـدا لـە فیعلـی مامـەزام تـۆ بـوگزەرە
هـەم عـەتا کـە شـەوقی ئـەزکارت هـەتاکوو فورسـەتە
ئەی"ئەسـەد" گـەر غـەرقی عوسیانی ئـەتۆ مەحـڕووم مەبـە
چـون خوداوەنـدت غـەفوور و، کـانی ڕەحـم و ڕەحمەتـە

## "موناجات ٢"

خاڵــــیە غــــەیرەز گونـــــە دار و دەر ودیــــواری مـــــن
حاڵــــیە هــــەر کــەس ببیـــێ ئـــاه و ناڵـــەی زاری مـــن
گــەرچی زەنــبم بــێ حــەدە بــێ عــەد بــە هــەویای ڕەحمــەتم
چونکـــــێ "*خەیرولغافیرینــــــە*"، خـــــالقی غـــــەففاری مـــــن
مــن کــە ئاگــاهیم لــە مەعــدووم و وجــوودی خــۆم نیــە
"*ڕەبــــەنا فەغفیرلــــەنا*"، ڕەحمــــێ بــــە حاڵــــی زاری مــــن
کــەس بــە کــردەی فیــسقی مــن ئاگــا نیــە ئــەوڕۆ، خــوودا
تـــۆ دەزانـــی پەردەپۆشـــی، ســـانیعی ســـەتتاری مـــن
پادشـــاهی فـــەردی ئـــەعزەم، ســـاحەبی ڕەحـــم و کـــەڕەم
ڕۆژی مەحـــشەر هـــەم خـــەفی کـــە، کـــاری ناهـــەنجاری مـــن
مـــــن دەزانم "*ئەشـــــــەڕڕونناس*"م ئـــــەمما یاکـــــــەریم!
عـــەفوی تـــۆ زۆر زۆرتـــرە، لـــە زشـــتیی کـــرداری مـــن
ئایـــەتی"*لا تقنطــــــو مــــــن رحمــــــةالله*" مووژدەیـــە
بـــۆ ئومیـــدی بەخشـــشی جـــەمعی، قەباحـــەت کـــاری مـــن
پادشـــاهی لایـــەزال و بـــێ وەزیـــر، ئـــەی بـــێ نـــەزیر
ســەرفی نــەزەر کــە لــەگوناه و، جوومڵــەیی ئــەوزاری مــن
تۆشـــە بـــۆ دەربـــاری شـــا، هـــەر لاڵـــیە و پاڕانـــەوە
ســەد هــەزار تۆبــە خــودا، ڕەحمــێ بــە ئیــستیغفاری مــن
تۆشـــە بـــۆ ڕێ کافیـــە گـــەر قەلبـــەن و قەولـــەن بـــڵێم
خالیقەڵـــــڵایە و ڕەســـــووڵە، ئەحمـــــەدی موختـــــاری مـــــن
مـــن ئەگـــەر ڕووڕەش ترینـــی موزنیبـــانم هـــەر خۆشـــە
چـــون " *شـــەفیعەلموزنبین* "ە، ســـەروەر و ســـەرداری مـــن
شەرمەســـــار و ڕووســـــیاهم یـــــا "ڕەسوولەڵـــــڵا" ئـــــەمان
خـــەم بـــووە پـــشتم، گرانـــە بـــاری عووســـیانباری مـــن
ڕۆژی دیـــــوانی جـــــەزا یـــــا" ڕەحمەتـــــەن لیلعالـــــەمین"
هـــەر تـــۆئی فـــەریادڕەس، بـــۆ داد و بـــۆ هـــاواری مـــن

وەک سەگی خوێڕی و خەجاڵەت ڕووم نیە بێمە حوزوور
گۆشە چاوێ بۆ دوو چاوی، ئەشکی خوێنین باری من
شاهی لەولاکی و قبوولە لای خودا قەول و ڕەجات
نیم نیگاهێ بۆ بەهەشت و، بۆ نەجاتی ناری من
تۆ پەناهی بۆ عاسیان و چارە بۆ بێچارەگان
من کەبێ چارەم عەتاکە، ڕەحمەتێ بۆ چاری من
وەک سەگی گەر ئاخری هەر چوو لەدووی ئەسحابی کەهف
تەوعەن وکەڕهەن غولامم، حەیدەری کەڕاڕی من
بۆ وەسیلەی چوونە ژێر ئالآی فەخری کائنات
"شا حیسامەددین"ە پیر و، مورشید و سالاری من
بۆ سوئالی قەبر و حاڵی نەزع و حوسنی خاتیمە
" شا حیسامەددین"ە یار و، یاوەر و غەمخاری من
یەک نەزەر هەر بەنیگاهێ خاترم دێوانە بوو
بریە گاهێ گریە گاهێ خەندەیە، ڕەفتاری من
باوەڕ ئەر ناکەن کە تیری چاوی مەستی دای لە دڵ
شاهیدەن فرمێسکی سوور و، زەردیی رووخساری من
شەرحی ئەوسافی حەمیدی ئەو بە من قەت نادرێ
چون مەقامی خاریجە لە وەسف و، لە ئیزهاری من
سەد شووکر یارەب غولامی ئاستانەی ئەو دەرەم
خاکی دەرکی کەحلی چاو و، مەرهەمی ئازاری من
نابەکاری گەر چی زۆرە هەر دەبێ بیلێ" ئەسەد"
" شاحیسامەددینە" دەسگر بۆ، تەواوی کاری من

## "موناجات٣"

یا غەفوور ئەو وەختەی ڕووحم قەبز دەکەن بێ ئیختیار
مەوریدی ڕەحمم، لە سوئی خاتیمەم کە ڕەستگار
یا کەریم هێند شەرمەسارم ڕووم نیە بچمە مەزار
ڕووسیاهی خۆم بەسە، ببەخشە تۆ بێ پرسیار
ڕووم نیە بمرم کە ئەعمالی بەدم دێتە نەزەر
شاد ئەبم گر فیکر ئەکەم عەفوت زیادە و بێ ژوومار
قادری دانا و توانا، فەردی ئەعزەم بێ شەریک
خالقی هەر دوو سەرا، ئەرزوسەما و لەیل ونەهار
هەر چی هەم چون عەبدی تۆ و ئومەتی "خەیرولرەسوول"
بەو ڕجام ئەر بچمە جەننات و نەعیم و نەچمە نار
دەرکی ڕەحمەت واسیعە و ئاواڵەیە و عاسیم ئەمن
مووسپی و ڕوو ڕەش، خەجیل هاتوومە دەرکی کردگار
بۆ جەمیعی هەر دوو عالەم تۆ پەناهی هەر ئەتۆ
هەر تۆ"تەووابوڕڕەحیم"ی بۆ عیبادی تۆبەکار
ئەوەل وئاخر ئەتۆی، هەم زاهیر و باتین ئەتۆی
هەر ئەتۆی لایق ببەخشی جورمی بەندەی نابەکار
هەر ئەتۆی لایق کە مانیع بی لە کافر بێتە غار
هەر ئەتۆی لایق کە حافیز بی لە سەمم و ژەهری مار
هەر ئەتۆی لایق کە ئاور کەی بە سەوزە و لالەزار
هەر ئەتۆی لایق کە تەیرێ شای لە سەر فیل خستە خوار
بەدترینی ناسم ئەرمن، کێ دەزانێ غەیری تۆ
هەر ئەتۆی لایق بپۆشی سیرڕی عەبدی شەرمەسار
گەر بە غفلەت عومرەکەم چوو غەیری عوسیان چم نیە
چون تۆ غەففاری، دڵم شادە و گەلێ ئوومێدەوار
گەر بە با چوو ڕۆژگارم ڕوو لەکێ کەم غەیری تۆ
یا"موجیبوودەعوە"عەفوی کە گوناهی پیری زار

یــا ئیلاهــی تــۆ بــە ڕەحمــەت، وەختــێ دەفنــی خــاک ئــەبم
باعیـــسی زەحمـــەت نـــەبم بـــۆ مردووانـــی هەمجـــەوار
گــەر"ئەســەد" زۆر نابــەکارە، عــالمی هــەر دوو ســەرا
عــەددی عــەفوت نــاتوانن هــەم بــە نووســین هــەم بــە زار

## "موناجات ٤"

یـــا "ڕەسوولەڵــــا" بـــە قورئـــان خاتـــەمی پێغەمبـــەری
بــۆ گـــورووهی موزنیـــب و عاســی شـــەفیع و ڕەهبـــەری
یـــا "ڕەسوولەڵــا" بـــە مـــەزلوومی حوســـەینی کەربـــەلا
گـــەرچی لایـــق نـــیم بفـــەرموو جـــووزوی کـــەلبانی دەری
یـــا"ڕەسوولەڵـــا" بـــە حـــوجبی فاتیمـــە و هـــەر دوو گوڵـــێ
بگـــره دەســـتم گـــەر ســـالاری دەشـــتی مەحـــشەری
یـــا"ڕەسوولەڵــــا" ئـــەتۆ بـــی و حورمـــەتی ئـــالی عـــەبا
بمخـــە ژێـــر ئاڵـــا مەفـــەرموو ڕووســـیاه و بەدفـــەڕی
یـا"ڕەسوولەڵـا" چ تـشنەم بـۆ جەماڵـی مـاهی ڕۆژی ڕووت
تەشـــنەگیم بـــشکێنە ئـــەو ڕۆژە کەســـاقی کەوســـەری
یـــا"ڕەسوولەڵـــا" ئەگـــەر تـــۆ ڕوحمـــێ دەربـــارەم نەکـــەی
عومرەکـــەم داوە بـــە بـــا خـــاکم بەســـەر دیـــدە وســـەری
یـــا"ڕەسوولەڵـا" تـــەڕەحووم کـــە بەحاڵـــی نـــەزع و مـــەوتم
تـا سـەگی مـەلعوون وەدەرنـێم بـۆ خـۆی و جـامی زەڕی
یـــا"ڕەسوولەڵـــا" پـــەناهی بـــۆ جـــەوابی دوو مەلـــەک
بـــۆ عـــەزابی گـــۆڕ و نـــاری دۆزەخ و دەردی ســـەری
یـا "ڕەسوولەڵـا" دەخیلێـک وەختـی کێـشانی حیـساب
نیمـە خێـرێ وەزن کـرێ هـەر گوناهـە و هـەر شـەڕی
یـــا"ڕەسوولەڵـــا" چ حـــەیرانم لـــە بـــەر پـــردی ســـیڕات
یـــک نیگاهـــێ تـا لـە سـەر پـردێ دەچـم بـۆ ئـەو بـەری
مەوریدی لوتفی ڕەسوولی ئـەی"ئەسـەد"چـون هـەرچی هـەی
تەوعـــەن وکەڕهـــەن غـــولامی شەهـــسەواری خەیبـــەری

## "کێ پەنایە غەیری تۆ؟""

کـــێ پەنایـــە غـــەیری تـــۆ شـــاهی وەڕا خـــەتمی ڕەســـوول
بـۆ"ئەسـەد" گـەر زەنبـی زۆرتـە لـە خیـز و خـاک و خـۆڵ
بە خیـاڵ هاتمـە حـوزوور جـوزوی سـەگان وێـستام لـە دوور
مووســـــەفید و ڕووســـــیاە وســـــەرفەکەندە و لارەمــــــل
تەوعـەن وکەڕهـەن سـەگی دەرکـم فیـدات بم یـک نـەزەر
تا بە تونـدی و چوسـت و چـالاکی وسـەریع دەرچـم لـەپول
گـەر نـەکیر و مـونکیر هـاتن پرسـیار کـەن لـێم دەڵـێم
مـن سـەگی "خەیرولئـەنامم" ئـەو دەزانـێ جـوزء و کـول
خـۆش بـە حاڵـی ئـەو کەسـە مەسـتە بـەبادەی مەیلەکـەت
سەرخۆشـە دایم دڵـی پڕیـە لەسـۆز و جـۆش و کـول
هەرکــە بێنێتــە نــەزەر شــوعلەی جەماڵــی ئــەنوەرت
دایـسێ قـەلبی بـە فـەوری دێتەچـەرخ وگێـژ و خـول
رۆژ کـە دونیـا رۆشـنە خـۆ نـووری خورشـیدێ نیـە
نـووری تۆیـە شـەوقی ڕۆژ و شـەو دەبینـێ چـاو و دڵ
بـۆنی ڕیحانـە و وەنەوشـەو و سـونبول و شـەوبۆ نیـە
عـەتری تۆیـە بـای سـەبا پەخـشی دەکـا بـەباغ و گـوڵ
بـۆ سـەنای تـۆ"ڕەحمەتـەن لیلعالـەمین" قورئـان دەڵـێ
کـێ بـڵێ نـەعتت بـە گوفـت و زمـان و دەم وپـل
چون" ئەسەد" پێی وایە کەلبی گوێ براوی قاپیـەی پێغەمبـەرە
سـەرخۆش و مەسـت وخومـارە تـا دەچێتـە ژێـری گـڵ

" بادەی نێرگس"

بە بادەی نێرگس و شەوبۆی پەرچەم
چ مەست و سەرخۆشە دڵ غونچە گوڵ دەم
دەمت ئاوی حەیاتە و ماچی لەعلت
دڵی مردوو دەکا زیندوو دەبا خەم
وەدەرخە خاڵ وڕوو کەعبە تەواف کەم
حەجەر ماچ کەم بنۆشم ئاوی زەمزەم
لەبی لەعلت بە دایم شەکر ئەڕێژێ
چ خێر بوو بەش منیش بازۆر نەبێ کەم
دڵ ئاوێزانی زولفی کرژ و خاوە
عیلاجی چۆن دەکا دووکتور بە مەرهەم
وەکوو فەرهادی شیرین شێوە شیرین
وەرە تا ڕووحی شیرینت فەدا کەم
" ئەسەد "سووتاوی شەوقی نووری ڕووتە
نیە ئارامی وەک پەروانە لەبۆ شەم

"ڕاستی مردن خۆشه..."

ڕاستی مردن خۆشه نەک ئیحتیاجی ڕۆژگار
هەر کەسێ ئەهلی تەوەققووع بێ زەلیلە و شەرمەسار
حەنزەلی بێ مینەت ئەر هیممەت ببێ خۆشتامە زۆر
شەکر وشیرینی بەمیننەت تاڵە هەر وەک ژەهری مار
پشتەکێشی کە و بە ئاسایش نەفەس دە ئەی فەقیر
ڕەنجی دەستی خۆت خۆشە نەک لووقمەی ناسازگار
قەت مەبە دڵخۆش بە کاشانەی بڵێد و قەسر و کۆشک
هیچ مەبە غەمگین بە کولبەت گەر نەوی بێ تەنگ، تار
کولبەیی دەروێشی و کاخە کەیان هەر وەک یەکن
بۆ کەسێ حەتمەن دەبێ بڕوا سبەینێ بۆ مەزار
دەگوزەرێ ڕۆژ ئەر نەبی تۆ شانشینی شانشین
ئاخری دێ شەو کە شامت بێ فەقەت نانی قەفار
دڵ مەبەستە بە دونیا چون عزورە و حیلەباز
گە دەکا حاڵت فەرەح گاهی دەکا قەلبت فوگار
بێ جیهەت یەکدەفعە یەکسەد خانەدان بەربا دەکا
بێ سەبەب ناکەس دەکا یەکسەد بەشەخسی زی ویقار
یەک کەڕەت ڕووت تێ دەکا ئیقباڵ و دەوڵەت بێ حیساب
یەک کەڕەت ڕوو وەردەگێڕێ بێ حەددە فەقر و عەسار
تا تەسەوورکەی نیە حوسنی کە یەک مەدحی بکەی
بێ تەفەککوور هێندە مەعیوبە دەلیلی زەممی هەزار
لاکن هێندە بەدکارە هەر ساعەت عەرووسە بۆ یەکێک
چۆن دەکا تەبعت قەبووڵ ئەر بووکی واکەی خاستگار
ئەی" ئەسەد" دنیا ژنێکە دیدە مەخموور و زەریف
لالە ڕەنگ و شۆخ و شەنگ و عیشوەدار

"مەدحی سنە"

ڕاستی مردن خۆشە نەک غوربەت و هیجری نیگار
لەحزەیە سەد مەرگە یارەب، حەسرەتی یار و دیار
جا وەتەن کوێ بێ سنە، وەبزانی باغی جەننەتە
دار ودیوار و ئەرازی وایە هەر وەک لالەزار
ڕوو لە هەر لاکەی عیمارەت هەر وەکوو قەسری بەهەشت
ئاوی حەوزی هەر وەکوو کەوسەر زوولاڵە و خۆش گەوار
هەر حەسارێ گەر دەچی لیمۆ وەکوو پستانی شۆخ
جیلوەیی گوڵ نەرگسی وەک عیشوەیی دیدە خومار
ڕایحەی دڵ سونبوولی وەک عەتری زولفی شاهیدان
زولفی گوڵناری وەکوو نایرەیی پشکۆیی نار
مەعدەنی عیلم و هونەر، کانی کەماڵ و مەعریفەت
پڕ لە عەللامە و فەرزانە ویەگانەی ڕۆژگار
هەر کەسێکی گەر دەبینی مونشیە و موستەوفیە
هەر لە ئەعیان و لە ئەشراف و لە ئەسناف و توجار
عالمانی موحتەرەم هەر یەک فەریدەی سەر زەمین
وەک ئیمامی شافعی پڕ لە عیلم و با فەزڵ و ویقار
"یائیلاهی" زاتی ئەقدەسیان هەمیشە ڕاگرە
تا قیامەت با شەریعەت هەر بمێنێ ئاشکار
خان و ئەعیانی یەکایەک هەر وەکوو حاتەم سەخی
زێڕ دەبەخشن پڕ بە مشت و زێو بە کیسە و شت بە بار
مەهوەشانی چاو پیاڵە پڕ لە مەی چۆن وەسف کەم
کوانێ باسی ماهڕویانی ئەو بە من دێتە ژمار
عوشری ئەوسافی سنەم بۆیە گوت تا کەس نەڵێ
بۆ دەناڵێنی شەوانە و نیتە ڕۆژانە قەرار
کەس نەکا مەنعم لە شەو ناڵین و ئاهی بەر بەیان
چۆن نەکەم شیوەن کە جەرگم لەتلەتە و قەلبم فوگار

ئـــاوری شـــەوقی عـــەزیزان وا لـــە جـــەرگم بـــەربووە
بـــاڵ وپـــەڕ ســـووتا بـــە جـــارێ لـــێم بـــڕا ســـەبر و قـــەرار
گـــەر قـــەزا بووبـــێ و قـــەدەر وابـــێ "ئەســـەد" قـــسمەت ببـــێ
زۆرخۆشـــــە ســــەیری دیـــــار ودیـــــدەنی یـــــاران بـــــەهار

"چ دەبێ؟"

دلبــەر چ دەبــێ رەحمــێ بــە مــەی بــێ ســەروپا کــەی؟
بــە شــەهدی لەبــەت دەردی دڵــی خەســتە دەوا کــەی؟
هەرچەنــدە کــە یەکــسانە وەفــا و جــەوری تــۆ بــۆ مــن
چــەن خێــرە کــە تــەرکی ســتەم و ڕەسمــی وەفــا کــەی
بیــستوومە کــە فەرمووتــە دەبــێ جــەرگی تــوا کــەم
ئــەو تالیعــە کــوا گــەر تــۆ بەئــەو عەهــدە وەفــا کــەی
ئــەو گیــان وســەر ومالّــە کــەوا مــن هەمــە دەیــدەم
بــەو شــەرتە کــە زولفــت لــە دولا هــەردوو بــلا کــەی
چــەن لوتفــە کــە جــارێ بــە کــەڕەم کەشــفی ڕوخــت کــەی
مــــسکین وگــــەدایان بــــە یــــەکبارە بەشــــا کــــەی
ســــووتاوە سەراســــەر لــــە فیــــڕاقت "ئەسەدوولّــــا"
وا چاکــە کــە ڕووحــی بــە نیگــاهێکی فــەنا کــەی

"هیلالی ئەبرووان"

هیلالـــی ئـــەبرووانت پــێم دەدەن ماهانـــە ماهانـــە
دە ئـەو مانگـە بـە قوربـانم کـە قوربـان جێژنـی قوربانـە
پیاڵـەی چاوەکـانی تـۆ ئـەڕێژن مـەی بـە سـەر دڵـما
دڵـم هێنـد مەسـتە نازانـێ بـە موژگـان تیرەبارانـە
وەرە خاهیش دەکەم ڕووحم! قەبووڵ کە لێم سەر و ڕۆحم
بـەهای عـەتری وەنەوشـە وشـەوبۆی ئـەو وردە خاڵـانە
بـەوە مـەعلووم بـووە ئـاوی حەیاتـە لەعلەکـەت دیـدەم
کـە نـامرێ هـەر کـە مـاچ کـا یەککـەڕەت ئـەو لێـوە ئاڵـانە
دەڵـێن بیمـار سـەیری بـاغ و ئـەکلی میـوە بـۆی چاکـە
عـەتا کـە سـا، لـە بـاغی سـینە ئـەو دوو لیمـۆ کاڵـانە
بە شـەوقی نـووری سـەر کولـمەت دڵ ئـارامی نیـە یەکـدەم
وەکـوو منـداڵ گـرووی گرتـە بـۆ ئـەو دوو سـێوە سـوورانە
تـەبیب چـارەی دڵـم چـۆن کـا دڵـم لای خـۆم نـەماوە مـن
لـە مێـژە حەبـسە،زنجیرە، بـە تـای ئـەو زولفـە خاوانـە
جەماڵـــت کەعبەیـــە قوربـــان مـــە تـــافی عالەمـــە بۆیـــە
تەماشـــای ڕەنـــگ و ڕوخـــسارت نیـــشانەی دیـــن وئیمانـــە
ئەگـەر بـەو نێرگـسە کاڵـە، نیگـاهێکی بـە مـن کـەی تـۆ
بـە مـەجنوونی دەبـێ ڕوو کـەم لـە ئـەو چـۆڵ و بیابانـە
"ئەسـەد" ڕۆح وسـەر و ماڵـی ئەگـەر مەتـڵەب بـێ بۆیـەتی
نیـــساری کـــا لـــە مەیخانـــە بـــە یـــادی چـــاوی جانانـــە

"دیدە مەست"

بــە خــودا دیــدە مەســت شــۆخی شــەم شــێوە
بـــۆ قەنـــدی لێـــوت ڕۆح لەســـەر لێـــوە
نیقـــابی لادە دەبـــا مانـــگ هەڵـــێ
هـــەتا ڕۆژ هەڵـــێ لـــە ســـەر ئـــەو کێـــوە
نازەکـــەت وەنـــاز نازەنینـــان چـــوو
تـــۆ حورەالعـــەینی لـــەم نێـــوە نێـــوە
ســـەروی باڵـــاکەت بـــە نـــاز دێـــو و دەچـــێ
چـــەن جوانـــە لیمـــۆی تـــازە هـــا پێـــوە
هـــەر کـــەس بـــێ بـــۆ ســـەیر ڕەوزەی ســـینەت
شـــەممی - بـــۆنی شـــەمامە ئـــەکا لـــە ڕێـــوە
هـــەر کـــەس بـــە بـــادەی دیـــدارت مەســـتە
لای یەکـــە، خاکـــە، زێـــڕە یـــا زێـــوە
"ئەســـەد" هەمیـــشە یـــادی تـــۆ دەکـــا
هەڵـــسێ! دانیـــشێ! ڕاکـــشێ لـــەجێوە

"سوبحانه..."

سوبحانه چەن غەریبە ئەو قەد وشەکڵ وشێوە
کێ دیویە داری عەرعەر جووتێ شەمامە پێوە
وام زانی ڕۆژی حەشرە غەوغا کەوتۆتە عالەم
نەمزانی مانگ دەبینن شۆخ دەرکەوتوە لەو کێوە
ئەو ڕووحە گەرچی هیچە تەقدیم دەکەم بە شەرتێ
عەتا بە خەستە دڵ کات یەک دوو لەو شلکە سێوە
دەمێکە من نەخۆشم بە تەشخیسی تەبیبان
دەوای دەدرم دووانە یەک غەبغەبە و دوو لێوە
"ئەسەد" ڕووحی هێناوە قەبوولی کە عەزیزم
ڕایخە لە جێگەی کەوشان بچنە سەری بە پێوە

"پرسیار و وەڵام"

گوتم: دەفعێک تەکەللووم کە گوتی: شەککەر بە با نادەم
گوتم: جارێک تەبەسسووم کە گوتی: قەت گوڵ حەوا نادەم
گوتم: لادە نیقابی ڕووت جەماڵت با تەماشا کەم
گوتی: بەسکە قسەی بێجێ خەلایق بە فەنا نادەم
گوتم: پەرچەم پەرێشان کە سەبا با عەنبەر ئەفشان کا
گوتی: چۆن ئەژدیها بەردەم هەموو کەس بەر بەڵا نادەم
گوتم: چۆن بچمە مەیخانە لە بەر ئەو چاوە کاڵانە
گوتی: بۆ مەستی بڕوانە لەوە زیاتر ڕەزا نادەم
گوتم: چۆن چاوە چاوکەم تا هیلالی ئەو بە چاوان کەم
گوتی: هەر چەن تەماشا کەی سەری زولفم وەلا نادەم
گوتم: ئەو نازی چاوانە بە مەی بفرۆشە بەوجانە
گوتی: مەجنوونی دێوانە نیگا وا بێ بەها نادەم
گوتم: رۆح هاتە سەر لێوم گوتی: چارەی بە چی دەکرێ؟
گوتم: قەندی لەبی لەعلت!گوتی: بەخودا دەنا نادەم
گوتم: قوربان کەڕەم کە پێم لە باغی سینە لیمۆیەک
گوتی: لیمۆی نارەس بەسەد لیرەی تەڵا نادەم
گوتم: ئیزنە لە باغی ڕووت کە سەیری سێوی سوورت کەم
گوتی: گەر ماری ڕەش بێڵێ ئەمن لێت لە هەرا نادەم
گوتم: بینایی چاوانم وەرە بیناکە چاوانم
گوتی: بە نەشتەری موژگان لە دۆستی با وەفا نادەم
گوتم: با بێمە گوڵزارت ئەگەرشەوبۆی شەوبۆ کەم
گوتی: غەیرەز سەحەرگاهان ئەمن عەترم بەبا نادەم
گوتم: تۆ هێندە مەحبووبی بەشەر ناتوانێ وەسفت کا
گوتی: زانا بەسە، خۆمن بە کەس مەدح و سەنا نادەم
گوتم: بێ تۆ دڵم تاریکە ڕازیت بێ چرا بێ وا
گوتی: نووری سەری کۆڵمم بەسە، ئیدی چرا نادەم

گــوتم: باڵـــات ئەگـــەر ســـەروە تـــورەنجی بـــۆچی هێنـــاوە
گوتی: تۆ زۆر دەڵێی، مـن دەسـت لـە کـرداری خـودا نـادەم
گـــوتم: ئاخـــەر عیلاجـــی کـــە، بەســـە، کاریگـــەرە دەردم
گـوتی: ئـەمری خـودا وایـە "ئەسـەد"، بـوری شـەفا نـادەم

"کەعبەکەم"

کەعبەکـــەم بـــەو تـــاقی ئـــەبرۆت قیبلەکـــەم گـــۆڕاوە بـــۆت
ڕۆحەکەم ڕووت وەک بەهەشت بەخاڵ و خەت نەخشاوە بۆت
نـــەک ئـــەمن تـــەنها ئەســـیری زولـــف و حـــەیرانی ڕووخـــم
دلبــــەرا شــــاهی وەڕا عالــــەم تەحــــەییور مــــاوە بــــۆت
شـای گوڵـان وەک تـۆ دەبـێ بـێ حـوکم وبـێ زنجیر و بەنـد
گـــەر دڵـــێ دڵ بـــێ بـــە زولفـــی خـــاو هەڵاوەســـراوە بـــۆت
چاوەکـەم بـە چـاوت بفـەرموو تـیر لـە سـەر تـیر لـێم نـەدات
چـــوون نـــەماوم ئـــەنگواوم خـــوێن وەکـــوو سێـــڵاوە بـــۆت
ورشەورشـــی کوڵـــمەکەت لـــێم ناگـــەڕێ هـــەر دایـــسێ
ئـــاوری خـــستە دەروونم جـــەرگ و دڵ بـــرژاوە بـــۆت
مونتـــەزیر مـــاوم لەســـەر ڕێ پـــێ لەســـەر چـــاوم بنـــێ
چاوەکـــەم ئـــارام بـــێ بەڵـــکوو چاوەکـــەم گریـــاوە بـــۆت
ســـینە خاڵـــی وەی لـــە حاڵـــی هـــەر دڵـــێ لـــەیلا ڕەشـــە
ئەسمـــەری قـــەد عەرعـــەرە، مـــەجنوون دڵـــی زووخـــاوە بـــۆت
بـــۆچ گوڵـــاو دەگـــری بەقەســـتی خـــۆ دەزانـــن عاشـــقان
عارەقە وعەتری شـەمامە وکوڵـمی وەک گـوڵ، گوڵـاوە بۆت
حوســـنی شـــیرین هـــەر یەکـــە فـــەرهاد عاشـــق بـــوو بـــەوی
تـــۆ هـــەزاران وەک "ئەســـەد"ســـەرتاقەدەم ســـووتاوە بـــۆت